# "باران و دڵۆپە"

کۆمەڵە شێعری سعیدی ئەمانی

چاپی یەکەم :

گولاٚنی ١٣٨٢ - ٢٠٠٣

چاپ : ئینتشاراتی ناوەندی کۆمەڵە

پێناسەیەکی کورت:

لەساڵی ١٣٣٩ی هەتاوی لە ئاوایی شیلاناوی بناری ئاسمانبلاغی ناوچەی سەقز لە بنەماڵەیەکی زۆر دەست کورتی ئەو ئاوایە پێم نایە ئەم دونیا پڕ لە نابەرابەری و چەوسانەوەیەوە وخولیای دەرس خوێندن و چوونە قوتابخانە هەر لە منداڵیمەوە بۆتە گرێمانەیەك و تا ئێستاش لەسەر دڵم بە قەدەر کێوی ئاسمانبلاغی قورسایی دەکات و بارە.

هەر چەند هەر کە فامم کردەوە کتیبێکم نایە ناو چارەکەی نان پێخورەکەمەوە، بە بێ ئەوەی بتوانم بیخوێنمەوە. شەو و ڕۆژ چاوم پێدا دەگێڕا تا لە ئاکامدا بە یارمەتی مامم فێری خوێندنەوەی بووم و تا ئیستاش پێم شك نایە بۆ مانگێکیش بووبێ لە کتیب جیا بوبمەوە، چ ئەو ٨ ساڵەی کە لە تەمەنی ٦ ساڵییەوە بوومە کارداری ماڵان بۆ ئەوەی منداڵەکانیان لە بەر بەرخەل بگەڕێنەوە و بچنە قوتابخانە و چ ئەو ٥ ساڵەی کە لە دوای ڕاپەڕینی پرشکۆی خەڵکی ئێران لە ساڵی ٥٧دا و لەبار چوونی ئەم شۆڕشە، بەهۆی چالاکی سیاسی بوومە میوانی کۆماری ئیسلامی و ئەم ٥ ساڵە لە سێ نۆبەدا تەکمیل بوو. لەلایەن پاسەوانانی سیاچاڵەکانی ئەم ڕژێمەوە ئەلحەق پەزیرایییەکی باشم لێکرا و ئەویش ڕەنگە بەپاسی ئەو لوتفەیان تا مردن لەبیر نەچێتەوە.

**ئیستاش بۆ ئەوەی جاریکی دیکە زەحمەتی میوانداری نەخەینەوە سەرشانی کۆماری ئیسلامی بە ناچاری سەری خۆم و ماڵ و منداڵم هەڵگرتووە و لە باوەشی (زڕگوێز)دا داگیر ساوینەتەوە.**

---

# پێرست :

بۆچی وایە

زۆنگاوی نەمان

بەراوردێك

چیان دەوێ

بۆدوکتور جەعفەر

هەست و...

زیندانی

بەهارە دیدار

ئاسەوار

وشکەساڵ

شێعرە سێو

مەترسی

سێبەر

راز

"      "

هیوا

کاروان

هانی هەستان

## " رێبوار"

سۆڵەی گڕی

ئەم سۆبانە

ناتوانن گەرمم کەنەوە.

ئەم گڵۆپە بچکۆلانە

ڕوناکی تەواونابەخشن

کوا ئەم کوێرە رێگایانە

ئەو شاڕێیەن

من دەمەوێ؟

کەی تەوسەنی

هەڵوەداییم
بە دووی خۆردا
بەهەوساری
ئەم بیرۆکە کورت و کۆنانە
دەسرەوێ؟
هاوار ... هاوار
لەم شەوگارە زستانیەدا
کەسیرە بووم.
ڕێبوارێکم
تائە و کاتەی
باڵە فڕەی مەلی ویستم
بە هەودایەك
کە زیەی زەردی
خۆرە تاوێ دەبەستمەوە
ڕێگە دەبڕم.
تیشکی سۆمای
چاوەکانی خۆشتم دەیە
ئەم گڵۆپە بچکۆلانە
ڕووناکی تەواو نابەخشن.
دستت بێنە
بیانخە ناودەستمەوە
سۆڵەی گڕی ئەم سۆبانە
ناتوانن گەرمم کەنەوە .

ئەمانی –٢/١٢/ ٧٥ هەتاوی بۆکان

## " شێعر چییە؟ "

شێعر چییە؟
خرکە بەردی
ئەم پرسیارە

گەلێك جاران
گۆمی بیری ئەو کەسانەی
هێشتا شیعریان نەناسیوە
هەژاندوە.
شێعر چییە؟
ئەم قامچیە
پشتی ئەسپی لێکدانەوەی
زۆر کەسانی
تەزاندوە.
لای من شێعر
کۆترێکە لە سەر بانی خانوویەکی
بەردمەڕمەڕی
تەقڵە دەکات .
ماسی نیگای مرۆڤیکی بێ ئەنوایە
لەنێو گۆمی:
ئارەقەی شەرمی ئەندامی
ژێر زەوینێکی
شێدارا
مەلە دەکات.
پشکووتنی گەزیزەیە.
ڕەنگی سیمای
گەڵای داری
پایزانە.
ئاوازێکە:
لە گەرووی شمشاڵی
شوانا.
لای من شێعر:
وردە هەنگاوی ڕاوکەری
چیای ژینە
بە شوێن جێگا پێی کەروێشکی

سرکی نانا!!

ئەمانی_٧/٥/٧٠ هەتاوی بۆکان

## " لێبران"

پەڵە هەورێك

بەڕێوەیە

کۆڵە باری بارانێکی

پەڵەی پێیە

بۆ شایی ئاسمان دادەگرێ و

دەبارێنێ .

لەسەر لێوی شەقار بەستوی

زەوی تینوو،

خونچە گوڵی

بەهارێکی بێکۆتایی

دەپشکوێنێ .

پەڵە هەورێك

بەڕێوەیە

کۆڵەباری بارانێکی

پەڵەی پێیە.

هەر دائەکات و

دڵنیام

ئەم بارانە

هەر دائەکات

گەرچی ئەم هەورە

مەترسی

گژە بایەکی ڕووگرژی

لە سەر ڕێیە.

ئەمانی ٧/١٢/٧٤ هەتاوی بۆکان

# " لاوێن"

لەسەر چڵی داری بێگەڵای
ئاواتە دێرینە کانیا
هەڵکورماوە
بە چەشنی مەلێکی تەنیا.
دووپەڕە سێلەکەی باڵ گرتوون
چاوەڕەش و برژانکە درێژەکانی
بەرەو شوێنێکی نادیار،
باڵ ئەکوتن و
بە قیلاوی شەوی تارا
هێدی هێدی دەڕۆنە خوار.
لاوێن وێنەی پەیکەرێکە
لەئامێزی هۆدەکەیا:
دانیشتوە
ماسی بیری:
لەنێو دەریای بیرەوەریە کۆنەکانیا
مەلەدەکات،
یان مەلێکە و
لەنێو باخچەی پرلە گوڵی
قاڵیەکانیا
وردە وردە
\چینە دەکات.
ڕەنگە؟ وێڵی سۆمای چاوە
ئەو سۆمایەی:
کەلەمەودای ساڵەکانی
ڕابردوودا
لەگەڵ کری تەونەکەیدا
تێوەی داوە

ئەمانی

# "ئەزموونێکی‌تر"

لەئامێزی

بێشکەی شەودا

کۆرپەی شارە

بەدەسرازەی

خەوێکی قورس

شەتەك دراو،

پەنجەی دایکی ئارخەیانی

هێدی هێدی

ڕایدەژێنێ.

بووکی شارە

لەکەژاوەی

بیری تەسکا

بەرەو زاوای

پیلان ئەڕواو

لەژێر چەتری شەوەزەنگا

بستێك  واوەتر نابینێ.

شاژنی شار

مل بەکوێن ودەم پڕهاوار

لەپاڵ گۆڕی

ئاواتە نێژراوەکانیا

پەنجەی حەسرەت

ئەکوتێ بەهەردك ئەژنۆو و

شەش پەڕی ئەزمونێکی‌تر

لە کەناری

کێلەکاندا دەچەقێنێ.

ئەمانی ــــــــــ١٧|٧|٧٥ هەتاوی

بۆکان

## "کێ بەرکێ"[٧]

کات

سواری

ئەسپی ڕەشەبایە

بەلەز

بێ پشوودان

ڕەوتی خۆی ئەکات.

شەنگە سواری

بیری منیش!

چارە وێکەی

لەگوڵ مێخی بێخەیاڵی

بەستۆتەوەو:

لەسەر خوانێکی

بیرەوەری کۆن

خەریکە ناشتای

ڕابردووی دەخوات!!

ئەمانیــــــ٨|٤|٧٤هەتاوی بۆکان

## "بەهار"

بەهار عەتری نزیك بوونەوەی

بە بەرۆکی

گوڵەباخی باخچەکەمدا پڕژاندووە

نووکی پەنجەی ئەرخەیانی

تەزووی ترسی

خونچەکانی تاراندوە.

لەناخەوە:

بەفرمێسکی ڕنووی بەفر

نێوچاوانی گرژی زستان

پێدەکەنیٚ.

ئەمانی___|١٢|٧٦هەتاوی ز_م

# "زیندە بە چاڵ"

ناتە ژێر پیٚ

بلووری بەڵێنەکانت و

زۆر لەخۆ بایش ڕۆیشتی.

میوانێك بووی:

ئیزنت نە خواست هاتیە ژووریٚ،

بیٚ ماڵ ئاواییش ڕۆیشتیی.

زەریایەکم

لە تاڵاوی پەژارە و

خەما سەر ڕێژم

چۆن بتوانم ؟

بۆهەتایە

سەڵای ئەم عیشقە ناکامەش

لە داوێنی

ناڵە شکێنەی

بیرەوەریدا بنێژم.

ئەمانی_ ٧٥/٤/٢٤ هەتاوی بۆکان

## ئاوێنەی رەنج...

له ئاوێنەی
ڕەنجی تۆدا:
بەسەر تەوێڵی
شەوەوە
ئاسۆیەکی
گەش دەبینم.
لەئاوێنەی ڕەنجی تۆدا:
بەسەر شانی
کازیوەوە
تەرمی شەوی
رەش دەبینم.
لەئاوێنەی رەنجی تۆدا:
له تەرازووی
داهاتوودا
بۆگشت بێبەشانی زەوی
بەش دەبینم
بەش دەبینم
ئەمانی___١|٧٥هەتاوی
بۆکان

## "بووژانەوە"

پاش وەرزێکی بەند و سەخڵەت
دەمەوبەهار
بەرەبەیان ئاسمان ساو بوو
سروشت سەرپاك چاوەڕوانی
تیشکی گەرمی خۆرەتاو بوو

مچوڕکی ترسی لەناوچوون
لەشی کلیلەی داگرتبوو
بزەی ژیانەوەی
دووبارە و
مان وەربوون
لەسەر لێوی کچی سروشت
بەدی دەکرا
خۆر لە ئاسۆ سەری هەڵدا
چڵکە هەورێك
ڕەش و نەزۆك
هێدی بە ئاسماندا خوشی
دەستی نایە بینی خۆر و
هێندی هێزی تیا بوو گوشی.

بۆکان___٨|١٠|٦٨هەتاوی
ئەمانی

## "باران و دڵۆپە"

پۆلە هەورێك
بەئاسماندا دەخولانەوە،
تێکدەهاڵن
لەئاسمانی شارەکەی من
لەنگەریان گرت
لەژیانی خەڵکی شار، ڕامان
سەبر، سەبر
ڕەنگیان گۆڕا
بروسکەی چاوی هەورەکان
شاری ڕووناك دەکردەوە
دەنگ و ناڵەی

توورە بوونیان

دەشت و کێوی

لەرزاندەوە .

بەخۆیان وت:

بۆ چی لێرە؟

یەکێ زەرد و ڕووت وبرسی و

یەکێ گەش وپۆشتە و تێرە.

یەکێ دانیشتووی ناو کاخە

یەکێکی دی

شوێنی ژینی

ناوچاردا خە

هەوری توورە وخەیاڵاوی

ئەسرین هاتەخوار،لەچاوی

بەوێنەی چاوی هەورەکان

گڵ وهەڵاشی میچەکەم

میچە کوور و نەویوەکەم

دڵی پربوو

وەکوو جاران

هێدی هێدی

فرمێسکی لێڵی دابارند!!!

ئەمانی_____٢٥|١١|٦٨هەتاوی

بۆکان

پێشکەش بەو منداڵە بێ‌نازانەی لەبەر نەداری خەریکی دەست فرۆشی و بۆیاخچییەتین."

# "سابیر بۆیاخچی"

سابیر ناوێك

مناڵێکی هەشت نۆ ساڵە

لەبەر جامی شوشە بەندی

دووکانێکدا

لەسەر سەنگ فەرشی بە بریقەی

پیادە ڕەوی

شەقامێکدا

کش ومات هەڵترووشکاوە

چەند قوتو واکسی جۆراوجۆر

لەگەڵ چەند فلّچەی

ڕەش وبۆر

لەسەرتەنەکە شکاوێك

لەبەر دەما ڕیزکراوە.

جارناجارێ

بەدەنگی بەرز

هاوار دەکات:

واکسی!!! واکسی!!!

چاوی سابیر فلّچەیەکە

بەسەر هەمووکەوشێکدا دێ و

ئەیان سڕێ

وەکوو بلّێی مشتەریە و

دەیان کڕێ.

گەر بیویستبا بەدەستە بۆیاغاوییەکان

ئارەقەی لێڵی ناوچاوان

بسرێتەوە

خەتێکی ڕەش، خەتێکی بۆر

دەکەوتە سەر

سیمای زەردی

هێدی هێدی

نەخشی دەبەست

تابلۆیەکی پرلە مەبەست !

## "ژوان"

تائاسمانی
ئەفغانستانی بیری تۆ
بەوردە داوی بۆچوونی
بڕوایەکی کۆن تەنرابێ
تا کابولی خوشەویستیت
تالیبانی
ترسێکی تۆخ
دەوری دابێ
ئەفسانەیە چاوەڕوانی:
هەڵفڕین و
هاتنە ژوانت.

تا بروسکەی پەنجەکانمان
یەك بکەوێ و
هەوری تاوانێك دابکا
تا تۆماری خۆشەویستی
بە ماچ مۆرکەین
سێدارەیەك
هەڵخراوە
کێلە سیپانی مێژومان
قەتڵگای عەشقی ناکامە و
جەستەی هەزاران سیامەندی
بەسینەوە
هەڵواسراوە!!

ئەمانی___١|١|٧٧هەتاوی

ز___م

# "نامەیەك"

بەم نامەدا
چەپکێك بەرامەی ڕێحانەی
سڵاوی خوشەویستیمت
بۆ ئەگریجەی
لاجانگی دووریت دەنێرم.
بەم نامەدا
سڕینی فرمێسکەکانت
بەدەسرۆکەی
نیانی خەیاڵ دەسپێرم.
ئەی ئازیزی
میسری ژیانم
ساڵەهایە:
بۆ تەڕەبووی هەندەرانت
کەبێتەوە
مەریوانی چاوەکانت
زریێباری
لەسەر ڕێدا ڕاخستوە.
ئەی پەیکەرەی ئازار و ئێش
باش دەزانم:
بۆ سەردانی بەندکراوت
هەموو جارێ
چەپکی نیگات
بەتێل بەندی دەوری شوورەی
بەندیخانەکان بەستوە.

هیوادارم پشکۆی شادیت
ژیلەموی خەم،
بە پێدزە نەیپۆشیبێ

هیوادارم کوچکە ڕەشەی
ورەی بەرزت
تەرمی سمکۆی
نامرادی،
بۆ نێو باوەش نەخوشیبیٚ.

ئەمانی___٨|٢|٧٧هەتاوی

ز__م

## "کۆچ"

وا هەست دەکەی
دوای کۆچت بەرەو گەرمێنی
بەهەشت ئاسای خەیاڵاتت
پۆلووی گەشی بیرەوەریت
بە ژیلەمۆی فەرامۆشی
داپۆشرابیٚ؟!
دوای ڕویشتنت
پەنجەی کەسەر
بەرۆکی شادی بەردابیٚ؟!
بڕوا بکە!
لەبیابانی تەنیایمدا
گشت کات وسات
سروەی یادت
سکڵی خەمی هەڵبڕانت
بێپشوو باوەشێن دەکات.
نەتزانیوە ئەم هەرێمە
لەو مەلەی لە پلووکە بەردی
کزە بایەکی پاییزی
بەرەو گەرمێن باڵ دەگرێت و
لەبیر دەکات هێلانەکەی

چەند بێزارە؟!

بگەڕێوە!

زەڕنەقووتە بێباڵەکان

چوار دەوەریان تەم ومژی

دڵە خورپە وئینتیزارە!!

ئەمانی____٢٣|٨|٧٨هەتاوی

ز_ب

## "گوشار"

ئەگەر بڕیار بوو

زستان وسەخڵەتی وتۆف

ئەگەر بڕیار بوو برسێتی و

شەوە زەنگی پڕترس و خۆف

ببنە هۆیەك

تا گیاندار و پەلەوەرە سەربەخۆكان

لەئاست بتی

کۆیلەتی‌دا

سەری تەسلیم بوون داخەن و

بێنە ڕیزی

دەستە مۆکان

دەبوو ئێستا:

هیچ هەڵویەك

سەربەستانە

بەتەشقی ئاسمانا نەفڕێ،

هیچ مامزێ

بەسەر یاڵە سەختەکانا

جەولە نەکاو

هیچ بولبولێ

گۆرانی بۆ
دڵدار نەچرێ.

ئەمانی___٤|٩|٧٥هەتاوی

بۆکان

## "ئەمەك"

لەو ڕۆژەوە:
تۆفانی لیم هەڵیکردو
پەنجەکانی لەپرچی بیابان هەلپێکا،

لەو ڕۆژەوە
یەکەم بارانی تینوێتی
بەسەر لێوەکانیا باری،
لەو ڕۆژەوە،
ئەندامی کەوتە بەرتاوی
ئەم ژانە تاڵە و پرووکا:
چی گوڵ و سەوزەڵانی بوو
بەجێیان هێشت.
تەنیا بنجێ
دروە شینە
لای مایەوەو
بووبەهاوبەشی ئازاری
بیابانیش
وەك کۆرپەیەك
لەئامێزی
خۆی وەرێنا و
مەمکەکانی
خستەزاری .

ئەمانی___١٠|١١|٧٥هەتاوی   بۆکان

# "ڕامان"

گڵۆپی ئەم شێعرە تازەم

لەسەر مالووسکەی خۆیانی

کێ‌ها داخ و کەسەر هەڵکەم؟

بەم شەماڵە

کامە سکڵی بن ژیلەمۆی

کوانووی دەروون باوەشێن کەم؟

چوونەی پاستاوی کام سوورمەی

خەمی ناخ بێ؟

تاشە بەردی جاڵە بووی سەر

کامە کوچکە ڕەشەی ئاخ بێ؟

ئەم پەنجەیە

پەردەی ڕووداوی کام تاوان

هەڵداتەوە؟

گرێ پوچکەی

کام کلاڤ ئاڵۆزاوی

ئەم سەردەمە بکاتەوە؟

ئەمانی___زستانی ٧٦هەتاوی

بۆکان

# "من و سلوول"

من و سلوول

دوو ناسیاوی لەمێژینەین

من شارەزای

ڕازەکانی نێو دەروونی و

ئەویش ئاگای
لەئەشکە نجەوئازارمە.

بەشەو و ڕۆژ
کێشکی خەون وئاواتەکانم دەکێشی و
دەنگی تێکەڵ
نزمترین هاوارمە.

ئەمانی___٩|٣|٧٦هەتاوی
ز_ب

## "گەشە"

خۆشەویستم
ئەوینی تۆ
نەمامێك بوو
لەناخی دڵدا چەقاندم
ئەونەمامە بۆتە داری
ڕنج و ڕیشەی
بە یەك یەكی
ڕەگەکانی هەموو لەشما
چۆتە خواری.

ئەمانی_| | ٦٨هەتاوی
بۆکان

## " لەباخی چاوەڕوانیمدا "

ئەم بەیانییە
"با"
لەجۆلانەی گەڵاکاندا

گەرای خستبوو

نەسرەوتنیش

پرچی سەمایەکی

بێکۆتایی دادەهێنا

## "تابلۆیەك"

وەزی بەهار

وەك بووكێکە

بەرلەوەی بچێتە سەرجێ

بەرگە سپیێکەی بووکێنی

دادەکەنێ.

ئەمانی___٨|٤|هەتاوی

بۆکان

## "گومان"

تەمی گومانم

سریوەی وتەت

هات ورەواندی.

چۆلەکەی بڕوام

داوە دۆزەی بوو

کاکڵی مەبەستت

چاوت گەیاندی.

ئەمانی____٢٣|١٠|٧٥هەتاوی

بۆکان

## "بۆچی وایە"

لەهەندەران

سەرکردەکان

سەرکەوتنیان لەتەسەلی

گەلەکەیاندا دەبینن.

مۆمی تەمەنیان لەرێگەی

ڕووناك کردنەوەی هەرێمی

بیر و زەینی

جەماوەردا

دەسووتینن.

لەلای ئێمەش

سەرکردەکان

بەپەیژەی برسێتی خەڵکا

دەچنەسەرێ !!

ئەستێرەی بەرژەوەندیان

لەشەوە زەنگی نەزانی

جەماوەردایە دەدرەوشێ!!

ئەمانی___١٨|٧|هەتاوی

بۆکان

## "زۆرنگاوی نەمان"

ساڵە هایە

تێخەڵەی ئەزموونێکی کۆن

بە هەسانی

ئامانج دەسوێ.

ساڵەهایە

دەئاژوێت و

سەر مەستانە ڕکێف دەکوتێ.

سەری سوڕما
لەدرێژی و نەبرانەوەی
ئەو ڕێگایە و
نەیزانیوە:
هەر چوارپەلی چارەوێکەی
لەزۆنگی نەمان چەقیوە.

ئەمانی_هاوینی ٧٦هەتاوی
بۆکان

## "بەراوردێك"

شەو دەرنگان
ئەوکاتانەی:
مرۆڤی شاد و بەختەوەر
لەتوێی نوێنی ئارخەیانیا
شەلەگەی ماچ هەڵدە بەستن.
شەو درەنگان
ئەو کاتانەی:
گەلانی بەئاکام گەیشتوو
لەسەر بەرماڵی شوکرانە
نوێژی شادی دادەبەستن.
لەنێو زاری ئەشکەوتێکدا
دەست بە ئەژنۆ
بەچۆرتی بیرەوەریەکان
من پیلانی دوژمنان و
خەیانەتی:
سەرکردەکانم دەژمێرم
لەبەربەیانی مێژووەوە
تاکوو ئەمڕۆ.

ئەمانی ١٣٧٥/٧/١٨ی هەتاوی

بۆکان

## "چیان دەوێ ؟ "

دەیانەوێ:

ماسی سرکی شێعرەکانم

لەتالاوی

ئەم سلوولەبەرتەسکەدا

بتاسێنن.

دەیانەوێ:

دانی ترس بڕێژنە بەر

پەرە سێلکەی شێعرەکانم،

هەر بەداوی کەلەپچەکەم

بیانگرن.

دەیانەوێ:

هێلکەی قەلی سەرنەواندن

بنێنەبەر

هەلۆی کورکی هۆنراوەم و

خۆم و نووسراوەم

پێکەوە

بەسێدارەی

سەرشۆڕیدا هەڵبواسن.

ئەمانی___٩|٣|٧٦هەتاوی

ز_ب

## "بۆدوکتور جەعفەر"

شنەی بەسۆزی

بیری تۆ، شەماڵێکە:

ڕەوە هەوری ناهومیدی

ئاسمانی ژین

ڕا دەماڵێ.

مەرەکەبی پێنووسەکەت:

هەتوانێکە

بۆسەر زامی تەشەنداری

چەوساوەکان.

وتەکانت:

هەتاوێکن

لەگوڵدانی دڵی ساردی هەژاراندا

گوڵی هیوا بە داهاتوو

دەپشکوێنن

وتەکانت:

وزەیەکن

چرای ڕێگای پڕمەترسی

شەوی تارمان، دایسێنن.

ئەمانی___٣١|٢|٧٤هەتاوی

بۆکان

## هەست و...

من و دەریایەك بیری ئالۆز

من وکێوێك خۆشەویستی و

عیشقی پیرۆز.

من و دەشتێك گۆرانی وسۆز

من وداخی:

دووری ئێوە بەسینەوە

من و باوەشێك ئاواتی

سەر لەنوێ ئێوە دینەوە

من وتاسەی:

ماچێکی لاچاوی فوئاد
من وبیری داهاتوویەکی نەچەندان دوور
وەرزی تاڤ لاوی فوئاد!!!

ئەمانی___٢٨|١١|٧٧هەتاوی

ز___م

## " زیندانی "

گەر بیەوێ
لە دەربیچەی
تەسکی سلوولی ژانەوە
بەرەو کووچەی
هەستی ئینسانی بڕوانێ
شووشی قامچی دەبنە پەردە.
گەر بیەوێ
مەلی فڕین دەستەمۆ کات
بە سێدارەوە دەنیشێ.
لەجیات پەنجەی حەوانەوەش
جەستەی
لەرز ڕایدەژێنێ
بەدرێژایی
تەمەنی گشت شەو و ڕۆژێ
وەرزێرێکە
لەمەزرای بیرو خەیاڵ
بۆ داهاتووی
تۆوی هومێد دادەچێنێ.

ئەمانی___بەهاری٧٧هەتاوی

ز___م

## "بەهارە دیدار"

لەم بەهارە دیدارە دا

نەرمە بارانی ئەوینە

بەسەر گەڵای

داری هەستمدا دەبارێ.

هاژەی کانیاوی تەقیوی

بناری خۆشەویستی‌یە

لە دەمارما دەگەڕێت و

لە جۆگەلەی ماچێکەوە

دێتە خوارێ.

لەم بەهارە دیدارەدا

گوێم لە خرمەی کێوی خەمە

هەرەس دێنی

خۆری هیوام لەساماڵا

پێدە کەنیٚ و

خۆ دەنوێنی.

٢٠٠٢|١٢|١٥

## " ئاسەوار"

بۆردوومانی

هێرۆشیما وناکازاکی

وەزنەیەکە:

تا ئەو ڕۆژەی

چەرخی گەردوون لەگەڕدایە

لەسەر شانی

ویژدانی مرۆڤایەتی

قورسایی دەکات وبارە.

ئاسەواری
کارەساتەکەی هەڵەبجەش
تاهەتایە
بەئەندامی پڕلەزامی
مێژووی کورد و
تەختی تەوێڵی ڕابردووی
خوێن ڕێژەکانیەوە دیارە.

ئەمانی___بەهاری٧٦هەتاوی
بۆکان

## " وشکە ساڵ "

ئێستاش زەوی
هەر شێدارە.
ئێستاش زەوی
لەشی خاوی
بارانەکەی
سەرەتای وەرزی بەهارە.
ئێستاش زەوی
هەر شێدارە.
تۆوی سالم بوەشێنین
تێیدا دەڕوێ
ناخی کێڵگە ئێستاش خاوی بارانەکەی
سەرەتای وەرزی بەهارە .

ئەمانی____٤|١٢|٧٥هەتاوی
بۆکان

## " شێعرە سێو"

بڕیارم دابوو

تا ماوم

بووکی جەفات

لەژێر تارای

فەرامۆشی یا

تماشا کەم.

وەکوو تۆ:

منیش – بەڕواڵەت –

لەگشت ڕووداوێ

حاشا کەم.

بە خۆم نییە

هەموو جارێ

پەنجەی یادێك

داری هەستم ڕادەژێنی و

شێعرە سێوێك

لە گوێسوانەی ئەوینەوە

دێتە خوارێ.

ئەمانی____٩|٨٠هەتاوی

## "مەترسی"

ئاکامی ژینی

زۆنگ و تالاو بوو

ئەسپی شەپۆلی

مەترسی دەریای

خستە سەر پاشوو.

ئەمانی

## "سێبەر"

نێشانەی گومانێکە
لەناخی جسمەکاندا
چون هێشتا بڕوای تەواویان
بە هەتاو نەهێناوە.

ئەمانی

## "راز"

کانی دای لە بەرۆکی ڕووبار
دەرزی ڕازی
بەدەریا گەیشتن.

ئەمانی

## "    "

ڕازی هەڵفڕینی هەور
لە ئەوینی بارین دایە.

ئەمانی

## " هیوا "

لە بێخاڵی خامۆشیدا
تاڤگەیەکی شەوەهای شەو
تیخی بەستەی بلاوێنت
بەندی رەشماڵی بێدەنگی
لێڕەواری هەڵبڕێوە.
لە دامێنی شەکەت بوونا

چاوەی کانی سەنگەرانی
لەوەتا هەی
تۆزی ماندویی رۆخساری
رێبواری یاغیت سرێوە.
لە ئامازۆنی ون بوونا
رێگایەکی بێمەترسی
لە گیژاوی دوودڵیدا
پاپۆری گەورەی یەقینی
لە توێی هەوری ماتەمینا
بارانێکی پێکەنینی
بارانێکی پێکەنینی.
ئەمانی – بۆکان

## " کاروان "

دەنگی زەنگی
کاروانێکم دیتە بن گوێ
لە پێدەشتی ئاواتە دێرینەکانما
هێدی هێدی
دێ و دەئاژوێ.
زایەڵەی زەنگی سەرقافلەی
ئەم کاروانە
ئەبیستم وا
بەنێو، جەرگەی شەوی تارا
رووە و ئاسۆ
بێ گوێدانە کۆسپ و رێگر
هەنگاو ئەنێ.
ئەم کاراوانە
درەختێکی بە دەیان جار

پەل کراوە و
کە چی ئێستاش بەپێوەیە.
ئەم کاروانە
ڕووبارێکە بەدەیان جار
سەددی لەبەر بەستراوە و
کە چی هەروا بەرێوەیە.
ئەم کاروانە
قەقنەسێکی بەدەیان جار
هەڵقرچاوە و
هەر زیندوە.
ئەم کاروانە
ڕێبوارێکی شاری خۆرە
سەدان ساڵە بەرێوەیە و
ماندوو نەبوە.

## "هانی هەستان" بۆ هاورێیەکی شاعیر

لەچی ئەدوێی؟
هاورێم، لە خەم؟
بۆ نازانی خەم تاوڵێکە
لە هەواری دڵی تەنگی
زۆربەی خەڵکا
هەڵدراوە.
لە چی ئەدوێی؟
تەمی ترس و بێ هیوایی؟
ئەویش چەشنی ئالأیەکە
لەسەر دوندی ئاسۆی هیوای
چەوساوانا هەڵکراوە.
لە شەو ئەدوێی؟

شەو بەرگێکە
سەدان ساڵە لە ئەندامی
ژینی ئێمە، هەڵگێشراوە .
لە چی ئەدوێی؟
لە خەو هەستان؟
باڵدارێکە!
ساڵەهایە:
لەسەر دیواری کەلاوەی
خەونەکانمان، هەڵکورماوە.
خۆ برسێتیش
نوردوو، نوردوو
لەناو سفرەی
هەموو ماڵە هەژارێکا
قەد کراوە.
لە تۆم دەوێ:
بۆم لە پەنجێرەیەك بدویی
لە پشتی شووشەکانیەوە
کیژی شادی
خۆ بنوێنی.
بۆم لە کزە بایەك بدوێی
تەم و مژێك برەوێنێ.
هاورێم وەرە.
بۆم لە ئاسۆگەیەك بدوێ
لە سبەینێی داهاتوودا
رۆژ بێتە سوێ.
بۆم لە قامچی و مشتێ بدوێ
کە تەزووی:
هانی هەستان بێ.
رێی هەرێمێکم نیشان دە

که لەوێدا:

ماڤ ژیانیکی ئینسانی

بۆ هەمووان بێ

بۆ هەمووان بێ.

ئەمانی – بۆکان ١٣٧٥/٣/١ی هەتاوی